# پێغەمبەری

# نەخوێندەوار




مامۆستا ناصری سوبحانی







ناوی کتێب: پێغەمبەری نەخوێندەوار

نوسینی: م.ناصری سوبحانی

وەرگێڕانی: د.عمر عبدالعزیز

دیزاین: کتێبخانەی گەشە

سەرپەرشتی چاپ: کتێبخانەی گەشە

نۆرەی چاپ: دووەم، ٢٠١٨ز - ١٤٤٠ک

نرخ: (١٠٠٠) دینار.

لە بەڕێوەبەرێتی کتێبخانە گشتییەکانی سلێمانی

ژمارەی سپاردنی (٥٤٧١)ی ساڵی (٢٠٠٨)ای پێدراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی وەرگێڕ

ئەم بابەتە وتارێکی مامۆستا (ناصر سوبحانی) یە، ساڵی (١٩٨٥ز) لە وەڵامی وتارێکدا بە زمانی عەرەبی نووسی، کە دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) نوسرابوو، لە گۆڤارێکدا بە ناوی (المنار) لە مانگی دوازدەی ساڵی (١٩٨٤ز) دا بڵاوکرابووەوە. نووسەری ئەو وتارە – بەگومانی خۆی – هەوڵی دابوو بیسەلمێنێ کە پێغەمبەر(ﷺ) تواناى خوێندنەوەو نووسینی هەبووە.

مامۆستا ناصر کاتێ ئەو وتارەی بینی، ناوەڕۆكو شێوازەکەی بە نازانستییو کاڵو کرچ زانی، بەڵام هەندێ لە براو دۆستانی، پێیان وت: خودی بابەتە ورووژێنراوەکە جێی بایەخە. دەکرێ ئەم وتارە بکرێتە دەرگایەك بۆ خستنە

ڕووی هەندیَ ڕاستییو ڕاستکردنەوەی هەندێك هەڵە
تێگەیشتن لە زاراوەو چەمكو بابەتە قورئانییەكان.

بابەتەكەی مامۆستا ناصر هێزو پێزێكی تایبەتی خۆی هەیە، چونكە بە شێوازێكی لۆژیكییو (ئیستقرائی)، لە دەلاقەی (ڕوانینە قورئانییەكان)ەوە بەدواداچوونێكی بابەتی نەخوێندەواریی پێغەمبەر (ﷺ) دەكاتو گومانی ئەو نوسەرەو سەدان هاووێنەی ڕەتدەكاتەوە.

ئەم وتارە لە سەرەتاوە لە گۆڤاری (نداء الغریب)دا بڵاوكراوەتەوە، كە لە ساڵی (١٩٨٥ز)دا لە شاری (پاوە)ی ڕۆژهەڵاتی كوردستان بڵاوبووەوە. ئێستەش بە مەبەستی سوودگەیاندن بە خوێنەرانی كوردزمان بە پێویستمان زانی وەریگێڕینە سەر زمانی كوردی. بابەتەكە هیچ جۆرە دەسكاریەكی تێدا نەكراوەو دەقاودەق ـ وەك خۆی ـ لە عەرەبییەوە بەرچڤە كراوە. بەڵام هەندێك

ناونیشانمان لە ناواخنی بابەتەکەدا داناوەو هەندێ ڕونکردنەوەی پێویستیشمان خستووەتە پەراوێز.

ماوەتەوە ئەوە بڵێین کە دەقە عەرەبییەکە دەقێکی هێجگار چڕو زانستییەکی بەبڕشتە، هەوڵ دراوە بە پێی توانا لە پرۆسەی وەرگێڕانەکەدا حەقی خۆی بدرێتێ.

بە هیوای سوودگەیاندن بە خۆشەویستانی پێغەمبەری ئیسلامی تامەزرۆیانی ناسینی ژیاننامەو تایبەتمەندییەکانی.

عمر عبد العزیز

کانونی دووەمی (٢٠٠٨ز)

# پێشەکی نووسەر



خوایە! حەق و ڕاستیمان بەڕاستی بخە پێش چاوو، توانای شوێنکەوتنیمان پێبەخشە..

نارەواییشمان بە نارەوا بخە پێش چاوو، توانای خۆ لادان لێی ببەخشە پێمان.. بە سۆزو ڕەحمەتی خۆت، ئەی بەسۆزترین بەڕەحم و میهرەبان!

پاشان..

بڵاوکراوەیەك بە ناوی (المنار) لە ژمارەی (١٩٨٤/١٢/٣١ز)دا بە وتارێکەوە کەوتە بەرچاومان، لەژێر ناونیشانی (تیڕوانینێکی قورئان - پێغەمبەری نەخوێندەوار- ).. نوسەری ئەو وتارە - کە خۆ بە توێژەر دەزانێ - وا گومان دەبا محمد پێغەمبەر (ﷺ) خوێندنەوەو نوسینی زانیوە (بە عیبارەتێکی تر: لە منالّیەوە کتابی خوێندۆتەوەو، بە دەستیشی نوسیویەتی).. بۆیە هەرکەس

وابزانێ پێغەمبەر (ﷺ) نەخوێندەوار بووەو، خوێندنەوەو نوسینی نەزانیوە، ئەوە – بەلای ئەوەوە – کوفرو بێبڕوایی‌یەکی ئاشکرایەو، بوختان و هەڵبەستراوە..

لەگەڵ خوێندنەوەی وتارەکە ئەو دەستەواژەیەم بیرکەوتەوە کە دەڵێ: تا بمێنی زیاتر دەبینی.. پاشان ڕەحمەتم نارد بۆ ئەوکەسەی خۆی دەناسێو قەدری خۆی دەزانێ.. هەروەها خۆزگەم خواست کە هەرکەس بەکارێ هەڵدەستێ، بزانێ چی دەکاو، چەندەی لە توانادایە، جا پێی هەستێ.. هەروەها هیوام خواست کە ئەو (توێژەرە)! هەوڵێ لەگەڵ خۆی بداو، پێش ئەوەی دەست بداتە کاری توێژینەوە، خۆی بەچاکی فێری زمانی عەرەبی بکا، تا دەستەواژەو ڕستەگەلێ نەهێنێ، کە گوێی مرۆڤ حەز بە بیستنیان نەکا.

ئەو وتارەمان خوێندەوەو بۆمان دەرکەوت کە بنەمایەك ئەم (توێژینەوەیە)ی لەسەر بنیاتنراوە ئەوەیە: گوایە نەبوونی

توانای خوێندنەوەو نوسین، ناتەواوی‌و کەمییە..

پێغەمبەریش (ﷺ) دوورە لەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم ناتەواوی‌یە نیسبەت بدرێتە لای،.. هەروەها..

لەڕاستیدا ئێمە لەبیری بەرپەرچدانەوەی ئاوا وتارێکدا نەبووین - لەکاتێکدا بێ‌سەرو بەری‌یەکەی ئاشکراو بەرمەلایە - بەڵام چەند برایەکی بەڕێز بە پێویستیان زانی کە دەبێ هەر گومان و شوبهەیەك کە دروست دەکرێ ، ڕەت بدرێتەوە، بۆیە بە پشتیوانی خوا ئەم بابەتەمان نوسی.

***

## جیاوازیی مرۆڤ لەگەڵ گیاندارانی تر:[1]



لەڕاستیدا ئەوەی مرۆڤ جیا دەکاتەوە لە ڕەگەزی گیاندار - کە نیشانەکانی گیانداریی تێیدا گەشەکردن و، نەوە خستنەوەو، هەست و جوڵەو بزاوتنە - بریتی‌یە لە ڕوحێکی خودایی کە هەڵگری ژیانێکی تایبەتە.. ئەو ژیانە تایبەتە دوو نیشانەی هەیە: یەکەم (علم)و زانیاری، دووەم (ئیرادە)و هەست. ئەو ڕوحە یەکەمیان-واتە (علم)- لەڕێی سێ هۆکارەوە بەکاردەهێنێ بۆ وەرگرتنی بەشێ لە بەشەکانی.

**هۆکاری یەکەم:** هێزی دیتن (بصر)ە، کە بریتی‌یە لە هێزێکی روح و، لەڕێی بەکارهێنانی چاوەوە کار دەکات

---

[1] - ئەو چەند ناو نیشانەی لەم وتارەدا هەن ، لە وەرگێڕەوەن و، لە وتارەکەی نوسەردا دانەنراون . (وەرگێڕ)

بۆ دیتنی نیشانەو بەڵگەکانی خوا لە بوونەوەرو گیانی مرۆڤەکان خۆیاندا، واتە بەشی (عالم الشهادة)، یانی دونیای بینراوو هەست پێکراو.

**هۆکاری دووەم:** هێزی دڵ (قلب)ە، کە هێزێکی تری ڕوحەو، لەڕێی بینراوەکانی هێزی یەکەمەوە، ڕاستییەکانی پشتەوەی دونیای بینراو، واتە بەشی (عالم الغیب)و، بەڵگەکانی زاتی خوای گەورەو نازناوەکانی هەست پێدەکا.. بەوجۆرە ئەوەندەی پێویستە لە بۆچوون و جیهانبینی، وەردەگرێ.

**هۆکاری سێیەم:** هێزی بیستن (سمع)ە، کە هێزی سێیەمی روحەو، لەڕێی (گوێ)وە کار دەکاو، ئەو شتانە وەردەگرێ کە نە (عالم الشهادە)یەو بینراوە، تا هێزی بینین ڕێی پێببا، نە دونیای پشت ئەم بەشەشە تا لەڕێی دڵ (قلب)ەوە پێی بزانرێ.. کەواتە هێزی بیستن حوکمە خودایییەکان وەردەگرێ. کە لەسەرێکەوە هەماهەنگی

دەکات لەنێوان جموجۆڵە (اختیاری)و (تسخیری)یەکانی مرۆڤدا، لەسەرێکی تریشەوە هەماهەنگی دەکا لەنێوان ئەو هەردوو جموجۆڵ و بزاوتنەی مرۆڤ، لەگەڵ باقی پارچەو بەشەکانی تری جیهاندا.. هەروەها ئەرکێکی تری هێزی بیستن بریتی‌یە لە وەرگرتنی ڕێنوێنی و هیدایەتە خواییەکان تایبەت بە چۆنیەتی بەکارهێنانی دوو هێزی بینین و دڵ (بصرو قلب)، چونکە بێ ئەو ڕێنوێنی‌یانە ئەو دوو هێزە نازانن و ناتوانن - وەك پێویست - بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەستن.

بەوجۆرە، لەڕێی بەکارهێنانی ئەو سێ هێزەوە - بەو شێوەیەی کە پێویستە - بۆچوونی تەواو دەربارەی خوای گەورەو، بونەوەرو، مرۆڤ ، دروست دەبێ.. هەروەها ڕەواو ڕاستی و حەق، لە ناهەقی بۆ مرۆڤ ، ڕوون دەبێتەوەو، نیعمەتی ئەو ئەحکامانە دەڕژێن بە سەریدا ، کە بیخەنە سەر شاڕێ و ڕێبازەکانی ئیسلام و، بێ‌نیازی

دەکەن لە شوێنکەوتنی حوکمی دەرون و شەیتان و، سەرەنجام خێرو چاکەی بۆ جیا دەبێتەوە لە شەڕو خراپە.

پاش ئەمانە پێویستە بزانین کە هێزی دڵ {کە لە قورئاندا بە (قلب) یا (فؤاد) ناوبراوە} کارێکی تریشی هەیە، کە بریتی‌یە لە بەرزبوونەوەی ئاستی ڕەغبەت و ترس (رَغَب و رَهَب) بۆ لای خوای میهرەبانی خاوەن سۆز، خوای خاوەنی ڕۆژی سزا، لەجێی ڕەغبەت و ترس بۆ هەر شتێکی تر کە بەدیهێنەرو خولقێنەر نیە، چونکە خۆی خولقێنراوە، بۆ هەر شتێکی تر کە توانای زیان و سوود گەیاندنی نیە، نە مردن و نە ژیان و نە زیندو بوونەوەی بە دەست نیە..

پاش ئەم هەڵدێرو وەردێرو ئاڵوگۆڕەی بەدڵدا، یا لەڕێی دڵەوە دێت، ڕۆڵی هێزی (ئیرادە)و ویست سەر هەڵ دەدا، ئەو ئیرادەیەی ـ کە لەڕێی ئەو ئومێدو ترسەوە ـ خاوێن و پاکژ دەبێتەوەو، تەسلیمی خوای کردگاری

فرمان بەدەست، (خالق)و (آمر) دەبێ.. بۆیە ڕێی حەق و ڕاستیو خێرو چاکە هەڵ دەبژێرێو دەیگرێتە پێش، یەکتا پەرستانەو دڵسۆزانە ڕوو ئەکاتە بەدیهێنەری ئاسمانەکان، دوور دەکەوێتەوە لە ڕشتەی هاوەڵ بڕیاردەرو (مشرکین).. ئەو هەڵبژاردنە بۆ ئەو ڕێیە مرۆڤ دەکاتە تاکێکی چاك و (صالح)، خواپەرست و، پشت بەستوو بەخوا، بەو جۆرەی کە پێویستە.. ئەوکاتە تەسکیی بازنەی کاری، یا نیازی بە بەکارهێنانی هۆکارو سوننەتە ڕامهێنراوەکان (السنن التسخيرية) - کە بە دەست مرۆڤ نین و، گۆڕین و جێگۆڕکێ پێکردنیان لە کەماڵ و تەواویی مرۆڤ نییە - هیچ زیانێکی بێ ناگەیەنێ..

***

# چۆنیەتی گەیشتنی مرۆڤ بە قۆناغی کەماڵ و تەواویی



سەرەنجام دەبێ بزانین کە کەماڵ [٢] و تەواویی مرۆڤ بەمانە دەبێ:

سەرەتا دەبێ ئایەت و نیشانەکانی خوا لە گەردوون و لە دەروونەکاندا ببینێ‌و، خوای گەورەو نازناوەکانی‌و ڕاستی‌یەکانی جیهانی (غەیب) و شاراوە، بناسێ‌و، زاناو ئاشنا بێ بەو سرووش و (وەحی)یەی خوا کە دەربارەی

---

[٢] مەبەستی مامۆستا ناصر لە کەماڵ و تەواوی بۆ مرۆڤ لەم وتارەداو هەر نووسی نێکی تریدا، ئەو ڕێژە دیاریکراوەیە کە لە ڕێی هیدایەت‌و ڕێنموییە خواییەکانەوە لە دونیادا پێی دەگات، نەك کەماڵ‌و تەواوی بە واتا زمانەوانییەکەی، کە تەنها شایانی خوای کردگارە . (وەرگێڕ)

ڕێنمویی هێزی بیستن و دڵ نێردراوە، کە حوکمی خوای کردگاری فرمان بەدەست ڕوون دەکاتەوە..

بە عیبارەتێکی تر بۆچوونێکی تەواو دەربارەی (خوا)و (بونەوەر)و (مرۆڤ) وەرگریّ، هەروەها بەها باڵا گشتی‌یەکانی هەموو بوارەکانی ژیان ـ بە ووردو گەورەوە ـ بزانیّ، پاش ئەوە هیواو ترسی تەواوی لە خوا هەبیّو، بە یەکجاری تەسلیمی پەروەردگاری ببیّو، بەوجۆرەی شایانو پێویستە ببێتە بەندەی خواو پشتی پیّببەستیّ..

بە عیبارەتێکی کورتتر،دەبیّ ببێتە بڕواداریکی چاکەکار (مؤمن)ێك کە (عەمەلی صالح) ئەنجام بدا.. دیارە ئەوەش بەندە بەهاتنی ڕێنمویی خوای گەورەو، بەکارهێنانی دروستی مرۆڤ بۆ ئەو هێزانەی خۆی کە ئاماژەمان پیّکردن..

سەبارەت بە ڕێنموییو (هُدی)ی خوایی، دیارە هیچ مرۆڤێك گومانی لەوەدا نیە کە وەرگرتنی ئەو ڕێنموییە

خوایی‌یە لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) هیچ پێویستی‌یەکی بە خوێندنەوەو نوسین نیە، چ لەڕێی فریشتەوە، چ خوای گەورە بیخاتە دڵی، یا هەر کەسی تر لەهەر کەسی تری وەرگرێ، هەروەها لەبەرکردنیشی هەر پێویستی بە خوێندنەوەو نوسین نیە..

سەبارەت بە بەکارهێنانی هێزو توانا مرۆیی‌یەکانیش - کە باسکران - بۆ غەیری بواری وەرگرتن و لەبەرکردن، دیارە لە شتە زۆر ئاشکراکانەو، هیچ پێویستییەکی پێی نیە.

***

## نەخوێندنەوەو نەنوسین بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ناتەواویی نیە:



بەمەی کە باسمان کرد ڕوون بوویەوە کە نەبوونی توانای خوێندنەوەو نوسین ،کەمی‌و ناتەواوی نیە لە مرۆڤایەتی هیچ مرۆڤێکدا، مەگەر کەسێك هەموو ڕێگاکانی گەیشتن بە کەماڵ و تەواویی لێ‌بەسترابێ، جگە ڕێی خوێندنەوەو نوسین.. جا ئەوە چ ژیریێکە گومانی وا بەرێ بە زاتێکی وەك محمد (ﷺ) کە خوا پەروەرشیاری بوو، جوبریل فێرکاری بوو، ئەشکەوتی حیرا قوتابخانەی بوو؟ گوێگرتنیشی لەوانەی (وحی) لە جیهانی دوور لە کاغەزو قەڵەم بوو ؟!

بەڕاستی نموونەی ئەو کەسەی کە پێغەمبەری خوا بەخۆی دەشوبهێنێ ـ بەوەی وا دادەنێ نەخوێندەواری و

نەنوسین ناتەواوییە - کەسی وا کافر دەبیٚ‌و، وەك ئەو کەسە عەجەمی‌یە - لە بەناو عەرەبەکان و غەیری ئەوان - وایە کە هیچ ڕێگەیەك شك نەبا بۆ زانینی زمان جگە لە خوێندنی کتێبەکانی زمانناسی، ئەوکاتە کەسێکی وەك (قس)ی کوڕی (ساعدە) بە خۆی دەچوێنیٚ‌و، بەدڵنیایی دەڵێ: هەڵەن ئەوانەی وا دەزانن ناوبراو کتێبی (العین)ی فەراهیدی، یا کتێبەکانی (سیبویە)ی‌و (عبدالقاهر)ی خوێندوە..

لەسەرێکی ترەوە هەقە بپرسین: ڕێگر چیە کە بیٚ‌توانایی خوێندنەوەو نوسین - ئەگەر بە ناتەواویشی بزانین - بدەینە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ)، لەکاتێکدا خوا شتی لەوە گەورەتری داوەتە پاڵ و، دەرهەقی فەرمویەتی : ﴿وَوَجَدَكَ ضَالّاً فَهَدَى﴾ [الضحى /٧].

واتە: خوا تۆی دوور لە هیدایەت و ڕێنموی بینی‌و، هیدایەتی دایت و ڕێی بۆ ڕوون کردیتەوە ؟

مەبەست لە (ضلال) بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دوورییە لە جیهانبینیو بۆچونی ئاینی دەربارەی خواو گەردون و مرۆڤ، هەورەها دووری لە بەها خواییەکان، هەرچەندە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دوور بوو لە بیرو بڕوای بت پەرستان و، خوو ڕەوشتە ناپەسەندەکان.. مەبەست لە (هدایە)تیش ناردنی ئەو بۆچونەیە دەربارەی خواو گەردون و مرۆڤ و، بەهاو ڕەوشتە خواییەکان..

هەروەها دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:
﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ﴾ [الشورى /٥٢].
واتە: هەروەها شتێك لە ڕوحی فەرمانی خۆمان بە وەحی بۆ ناردی، تۆ نەتدەزانی (کتاب) چیە، یا (ئیمان) چیە..

## قورئان دوپاتی دەکاتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) نەخوێندەوار بووە:



جا کاتێ بۆمان دەرکەوت کە نەخوێندنەوەو نەنوسین نا تەواویی نیەو، ئەگەر بە گریمانە ناتەواویش بێ، نیسبەتدانی بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) گوناه نیە، پاش ئەوە دەڵێین: قورئانی پیرۆز دوپاتی دەکاتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ وەحی بۆهات شتی نەدەخوێندەوەو، شتیشی نەدەنوسی، دەفەرموێ:﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾ [ العنكبوت/ ٤٨ ].

واتە: پێش هاتنی قورئان هیچ کتابێکت نەدەخوێندەوەو، بە دەستیشت نەتدەنوسی، چونکە گەر وابوایە هەرزەو بەتاڵ گۆیان دەکەوتنە گومان.

ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەوەی ڕاستەوخۆ ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەر (ﷺ) نە (خوێندنەوە)ی بووە، نە (نوسین)، ئەوەش دەگەیەنێ کە هەر تواناشی نەبووە ئەوە بکا، واتە باس لەوە نیە زانیبێتیو نەیکردبێ، بەڵکو باس لەوەیە کە نەیتوانیوەو نەیزانیوە، بۆیە نەیکردووە، چونکە کەسێك نوسراوێکی نەخوێندبێتەوەو، شتێکی نەنوسیبێ، دیارە توانای ئەوەی نەبووە، چونکە توانای خوێندنەوە بە ڕاهاتن لەسەر خوێندنەوەو، توانای نوسین بە خۆڕاهێنان لەسەر نووسین دەبێ.

ماوەتەوە ئەوە بلێین: نابێ بگوترێ مەبەست لە وشەی (کتاب) لەو ئایەتانەی سەرەوەدا کتێبی نێرداوی خوایە - وەك ئایەتەکانی پێش ئەوە وادەگەیەنن - بۆیە ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەر (ﷺ) پێش قورئان تەورات و ئینجیلیشی نەخوێندۆتەوە، نەك ئەوە بگەیەنێ کە نە خوێندنەوەی بووە، نە نوسین.. نەخێر نابێ ئەمە بگوترێ،

چونکە وشەی (کتاب) لە ئایەتەکەدا بە نادیاریو (نکرة)یی هاتووەو، لە سیاقی (نفی)شدا هاتووەو، ووشەی (مِن)یش چۆتە سەری، کە هەمیشە بۆ ئەوە بەکاردەبرێ ئەو حوکمەی مەبەستە بگەیەنرێ، هەموو تاکەکانی وشەکەی پاش خۆی بگرێتەوە، بۆیە کە وتراوە (من کتاب) هەرچی چەمکی (کتاب) بیگەیەنێ، دەگرێتەوە.

دیارە نمونەکانی (کتاب)یش قەتیس نین لە کتێبە نێردراوەکانی خوادا ( تا بلێین: تەنها مەبەست تەورات و ئینجیلە). ئەوەتا ئەم قورئانە خۆی وشەی (کتاب)ی بۆ نوسراوێ بەکارهێناوە کە مرۆڤ بۆ مرۆڤی نوسیوە: دەربارەی سولەیمان پێغەمبەر (علیه السلام) کە بە پەپوسلێمانەی ووت: ﴿اذْهَب بِّكِتَابِي هَذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ﴾ [النمل/ ٢٨].

واتە: سولەیمان بە پەپوسلێمانەی ووت: ئەم (کتاب)ەم بەرە، بیدە پێیان، پاشان پشتیان لێ هەڵکەو چاوەڕێکە بزانە

چیم بۆ دەنێرنەوە.. (بەڵقیس) ووتی: ئەی خەڵکی دەوروبەرم! من کتابێکی پڕ کەرەمم بۆ هاتووە، لە سولەیمانەوەو ئەمەیە : بەناوی خوای میهرەبانی بەخشندە.. ئاگاداربن! خۆتان بەزلتر مەزانن بەسەرما، وەرنە لام و موسڵمان بن.

***

## له ئەگەری خوێندەواریی پێغەمبەردا (ﷺ) گومان لەسەر قورئان دروست نابێ:



له سەرێکی تریشەوە دەبێ کەس هەرگیز ئەو گومانە نەبا کە جەخت کردنەوە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) پێش هاتنی قورئان خوێندنەوەو نوسینی نەبووە، بۆ ئەوە بووە بیسەلمێنێ کە قورئان وەحیو سروشی خوایە، گوایە ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) شتێ لە کتێب خوێندنەوە یا نوسینی هەبوایە، شك و گومان ڕێی تێدەچوو، دەشکرا ئەوە بکرێتە بەڵگەی گومان خستنە سەر خوایی بوونی سەرچاوەی قورئان..

بەڵێ، نابێ کەس ئەم گومانە بەرێ، چونکە قورئان زۆر لەوە گەورەترە کە کەسێ گومان بەرێ لە غەیری خواوە هاتووە، هەرچەند ئەو سەرچاوەیەی غەیری خوا زانا بێ بە

هەموو کتێبە نێرراوو نە نێرراوەکان، بگرە ئەگەر ڕەگەزی مرۆڤ و پەری هەموویان کۆببنەوە لەسەرئەوەی نموونەیەکی ئەم قورئانە بێنن، ناتوانن نموونەی بێنن، هەرچەند هەندێکیان ببنە پشتیوانی هەندێکیان.. ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَـذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً﴾ [الإسراء /٨٨ ].

بۆیە ئەگەر گریمان محمد (ﷺ) پێش هاتنی قورئان، خوێندنەوەو نوسینیشی بووبێ، تەنها بە تالّبێژان (مبطلين) دەکەوتنە گومان.. وەك ئایەتەکەی پێشەوە فەرمووی: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾ [العنكبوت /٤٨ ].

واتە: هەرگیز ڕاستبێژان و (محقين) ناکەونە گومان بەو ئەگەرە، ئەوە (مبطلين)و ناهەقبێژو هەرزە گۆیانن، کە بە ئاوا ئەگەرێ گومانیان لە سەرچاوەی خوایی بوونی قورئان بۆ دروست دەبێ.

## وشەی (اقْرَأْ) لە ئایەتی ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ خوێندەواری پێغەمبەر (ﷺ) ناگەیەنێ

لەسەرێکی ترەوە نابێ کەس ئەو گومانە بەرێ کە ووشەی (إقْرَأْ) واتە: بخوێنەرەوە، لە ئایەتی﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەدا توانای خوێندنەوەی هەبووە، چونکە وشەی (قراءة) واتە خوێندنەوە بریتی‌یە لە کۆکردنەوەی چەند ڕستەیەکی پێکەوە گونجاو و، بە زارا هاتنیان بۆ ڕونکردنەوەی مەبەستێك، ئەمەش ئەوە ناخوازێ کە نوسراوێك هەبێ و سەیر کرێ. هەروەها وشەی (کتاب)یش لە بنەڕەتدا بە چەند عیبارەتێکی هاوئاهەنگ دەگوترێ، کە هەندێکی بەتوندو تۆڵی بە هەندێکی تریەوە بەستراوەتەوە.. بەم پێیە نوسراوە (مخطوط) ئاسەوارێکە دەبێتە نیشانەی (کتاب)، نەك خودی (کتاب).

## ئایەتی ﴿الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ﴾ فێرکردنی پێغەمبەر (ﷺ) ناگەیەنێ



لە لایەکی دیکەشەوە نابێ ئەو گومانە ببرێ کە ئایەتی ﴿الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ﴾ [العلق / ٤ ]، بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) پێش یان پاش هاتنی وەحی، نوسینی زانیوە.. ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە قەڵەم هۆکاری فێرکردنە، ئیتر ئەوە ناگەیەنێ کە بەبێ قەڵەم، فێرکردن ئەستەمە، یا ڕووی نەداوە.

**مەبەست لە وشەی (أمي) و (أميين):**

بەڵام سەبارەت بەو توێژەرە (!)ی کە گومان دەبا مەبەست لە (أمي) و (أميين) ئەو کەسە یا ئەو کەسانەیە کە

نیسبەت دەدرێنە پاڵ (أم القرى)، [٣] دەڵێین: ئەم گومانە لە دوو ڕووەوە پێچەوانەی ڕاستی‌یە: لە سەرێکەوە لەبەرئەوەی وشەی (أم القرى) عەلەم و نازناوێ نیە بۆ شاری مەککە، بەڵکو ناوێکە هەموو گوندێکی گەورە دەگرێتەوە، کە چەندین گوندی بچوکی بە دەوردا بێت[٤]، بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرمودەی خوایە کە دەفەرموێ:﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولاً يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَى إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ﴾ [ القصص / ٥٩ ].

---

[٣] ئەو بە ناو توێژەرە بۆیە وای گوتووە، تا ئەوە بگەیەنێت وشەی (النبي الأمي) بە واتای نەخوێندەوار نیە، بەڵکو بە واتای نیسبەتە بۆ شاری (أم القرى) کە مەککەیە. (وەرگێڕ).

٤) لە کوردەواریدا پێی دەگوترێ (گەورە دێ)، یان (شا دێ). (وەرگێڕ).

واتە: پەروەردگاری تۆ بڕیاری نەداوە گوندو شارو شارۆچکەکان خاپور بکات، تا لە گەورەترینیاندا پێغەمبەرێك نە نێرێ‌و، ئایەتەکانی ئێمە بەدوای‌یەکدا نەخوێنێتەوە بۆیان.

کەواتە وشەی (أمي) - لەگەڵ ئەو گریمانەیەشدا کە نیسبەت بێت بۆ وشەی (أم القرى) - تەنها بۆ ئەو کەسە بەکاردەبرێ کە خەڵکی گوندێکی گەورە بێت، کە چەندین گوندی تر دەورەیان دابێ، ئیتر ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو کەسە مەککەیی‌یە.

پاشان نیسبەت دان بۆلای ناوێك کە بە وشەی (أم) یا (أب) دەست پێ‌دەکات، بۆ بەشی دووەمی دەبێت، واتە بۆ وشە (مضاف إليه)ی یەکەی پاش (أم) یا (أب)، بۆ نموونە نیسبەتدانە پاڵ (إبن عمر) دەبێتە: (عُمَرِيّ)، یا نیسبەت دان بۆ (إبن عباس) دەگوترێ: (عَباسي)، بەم پێیە بە کەسی

نیسبەت دراو بۆ لای (أم القری) دەگوترێ (قُرَوِيّ) نەك (أمي).

ئەمە لەڕووی یەکەمەوە، لەڕووی دووەمەوە: هەرکس دەیەوێ تەواوی ئەو شوێنانەی بۆ ڕوون ببێتەوە کە ئەو دوو وشەیەی (أمي)و (أميين)ی لە قورئان تێدا هاتووە، با لەم چەند ئایەتە ووردبێتەوە، تا بێسەرو بەری ئەو مفتەبێژی‌یەی بۆ دەرکەوێ:

* لە سورەتی (البقره)دا - پاش باسی ئەو جولەکانەی کە ئاشنا بوون بە کتابی تەورات و، قسەی خوایان دەگۆڕی –دەفەرموێ:﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لاَ يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلاَّ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ﴾ [ البقرة / ٧٨ ].

واتە: هەندێ لەوانە نەخوێندەوارن، لە کتێب نازانن، جگە لە هەندێ خۆزگە، گومان بردنیش زیاتر هیچێکیان نیە.

جا ئایا هیچ ژیرێك بەخۆی مۆڵەت دەدا کە وا گومان بەرێ مەبەست لەم وشەی (أمیون)ە، (مکیّون) بێ ؟[٥] هەروەها ئایا ووردبوونەوە لە دابەشکردنی جولەکە بۆ دوو گرۆی جیاواز ـ لە هەڵوێست گرتن لە تەوراتی کتێبی خوا ـ لەو ڕوەوەیە کە (مکيّ)و غەیرە (مکيّ)ن ؟ ئایا ئەو توێژەرە! نازانێ کە ڕاڤەکردنی ووشەی (أمیون) لەو ئایەتەی سەرەوەدا بە (مکیون)، پێویست دەکا کە قسەیەك بکا پێچەوانەی مەبەستەکەی خۆی؟ چونکە نەبوونی زانست و ئاگاداری (کتاب)، هۆکەی (مەککەیی)بوون بێ ـ وەك ئەو ڕایە دەڵێ ـ بەڵگەیە

---

٥) واتە نیسبەتدان بێ بۆ (أم القری) کە لە پێشەوە هەڵەیی ئەو کارەی لە ڕووی زانستی زمانەوانیی‌و ڕێزمانی عەرەبییەوە خستە ڕوو. جا کێ وا گومان دەبات (مەککە) شاری جولەکەنشین بێ، با وا تێ بگاو با بەوجۆرە تەفسیری ئایەتەکە بکا! (وەرگێڕ)

لەسەر ئەوە کە شاری مەککە دوورترین وولاتی ئاوەدانی جولەکەیە لە خوێندنەوەو نوسین [٦] ؟!

* لە سورەتی (آل عمران)یشدا پاش ئەوەی ئاماژە دەکا کە ئاین لای خوای گەورە ئیسلامە، هەروەها پاش ئەوەی باس لەوە دەکا کە جیاوازیو ناکۆکی خاوەن کتێبەکان، لەسەرکەشی خۆیانەوە سەرچاوە دەگرێ، نەك لە بێئاگاییانەوە لە حەق و ڕاستی، هەورەها پاش فەرمان دان بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئاگاداریان بکا لە هەڵوێستی خۆیو شوێنکەوتووانی.. پاش ئەمانە دەفەرمووێ:﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ وَالأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ﴾ [آل عمران / ٢٠ ].

---

٦) مەبەستی ئەوەیە سیاقی ئایەتەکان باسی جولەکەو نەخوێندەواری هەندێکیان دەکاتو هیچ پەیوەندیەکی بە باسی پێغەمبەر(ﷺ)و شاری مەککەوە نیە. (وەرگێڕ)

واتە: بەوانەی کتێبیان بۆ نێرراوەو، بە نەخوێندەوارەکانیش بڵێ: ئایا موسڵمان بوون؟

لێرەدا ئاشکرایە کە مەبەست تەواوکردنی بەڵگەیە بەسەر خەڵکی‌یەوە بەگشتی، ـ لەوانەی کتێبیان بۆ نێرراوە ( واتە ئەوانەی ئاشنان بە کتێبی خوا بەڵام لەڕووی سەرکەشی‌یەوە پشت هەڵئەکەن)، لەوانەش کە (أمي)ن، (واتە ئەوانەی کە نا ئاشنان بە کتێب) ـ نەك تەنها ئەو(مەککەیی)یانەی نا ئاشنان بە (کتاب).

* هەروەها لەسورەتی (آل عمران)دا هاتووە، دەفەرمووێ: ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لاَّ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلاَّ مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِماً ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ [ آل عمران / ٧٥ ].

واتە: لە ئەهلی کتاب هەندێکیان هەن کە ئەگەر بارێکی زۆر [7] ، ئەمانەتی لەلا دابنێی، بۆت دەگێڕێتەوە، هەندێکیشیان ئەگەر تاکە دینارێکی لەلا دابنێی، بۆت ناگێڕێتەوە، مەگەر کاتێك بە دیاریەوە ڕاوەستیت، (ئەوانە بۆیە وادەکەن) چونکە دەیانگووت: ئێمە لە ئاست نەخوێندەواراندا (کە مەبەستیان موسڵمانەکانە) لێپرساونین (واتە ئازادین هەرچی بەرامبەریان بکەین، لە فێڵ لێکردنیان، یا سامان خواردنیان)، ئەوانە درۆ بەدەم خواوە ـ لە ڕووی ئاگاییەوە ـ هەڵدەبەستن.

لێرەدا هیچ ژیرێك گومانی لەوە نیە کە مەبەست لە وشەی (أمین) خەڵکانی غەیری ئەهلی کتابە، نە تەنها خەڵکی مەککە. هەرکات وشەی (أمین) لەگەڵ باسی

---

٧) وشەی (قنطار) لە زمانی عەرەبیدا بە واتای بارێکی زۆر لە زێڕو زیو، یان ئەمانەتی نەختینە، هاتووە. (وەرگێڕ)

ئاشنایان بە (کتاب) هات، ئەوە مەبەست هەموو ئەو کەسانەیە کە خوێندنەوەو نوسینیان نیە لە جولەکەو غەیری جولەکە، وەکو لە دوو ئایەتەکەی پێشەوەدا دیاریدا..

هەرکاتێکیش وشەی (أمیین) لە شوێنێکدا هات کە باسی (أهل الکتاب)ی لەگەڵدابوو، ـ کە گشتی ترە لە ئاشنایان بە (کتاب)ـ ئەوە مەبەست هەموو ئەو کەسانەیە کە ئەهلی کتاب نین، وەك لەئایەتی سێیەم‌و ئایەتی داهاتوودا دیارە.

* لە سورەتی (الجمعة)شدا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ...﴾ [الجمعة / ٢]. واتە: خوای گەورە ئەو خوایەیە کە لەنێو نەخوێندەوارەکاندا پێغەمبەرێکی ناردووە لە خۆیان.

دواتر پاش باسی فەزڵ و رێزنانی خوا لێیان رستەی: ﴿الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا..﴾ [ الجمعة/٥ ] هاتووە، واتە: ئەوانەی تەورات درا بەسەرشانیاندا، پاشان هەڵیان نەگرت و، (لە مەسئولیەتی

له ئەستۆگرتنی دەرنەچوون) (مەبەست جولەکەیە بەتێکرِایی).. دیارە گومان لەوەدا نیە کە ئەو تاقمەی جیاوازن لە جولەکەی هەلّگری تەورات، بریتین لەوانەی خوا رِێزی لێناون و فەزلّی بۆیان هەبووە، نەك بە تەنها خەلّکی مەککە.

* بەم جۆرە رِوون دەبێتەوە کە مەبەست لە عیبارەتی (الأمي) لە ئایەتی: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ....﴾ [الاعراف /١٥٧]. واتە: ئەو نێرراوە پەیامبەرەی کە لە ئەهلی کیتاب نیە.. بەلّێ، رِاستە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە توانای خوێندنەوەو نوسینی نەبووبێ، چونکە لە غەیری ئەهلی کیتاب کەسانی تریش هەن کە خوێندنەوەو نوسینیان هەبووە (ئەمە پێچەوانەی ئەوە نیە وشەی (أمي)یان بەسەردا ببرِێ، چونکە - وەك پێشتر رِوون کرایەوە - وشەی (أمي) بەرامبەر (أهلی کتاب) بەکاربراوە، نەك بە واتای کەسانێ کە ئەهلی خوێندنەوەو

نوسین نین) بەڵام ئایەتی: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ﴾ [العنكبوت /٤٨ ]. واتە: تۆ پێش ئەم قورئانە هیچ کتابێکت نەدەخوێندەوە، بە دەستیش نەتدەنوسیەوە، ئەم ئایەتە هێندە ڕوون و ئاشکرایە، کە هیچی تری ناوێت..

* ماوەتەوە ئەوەش بڵێین کە ئەگەر وشەی (أمي) نیسبەتیش بێ بۆ (أم القرى) ـ وەك ئەو توێژەرە (!) گومان دەبا ـ ئەمە هیچ دادێ ناداو سودی نیە بۆئەوەی ئەو مەبەستیەتی، چونکە خۆ هەموو کەسێکی خەڵکی مەککە خوێندەوار نەبووە، یا نوسینی نەزانیوە.

* ئەمە ئەوە.. ئەوەش دەبێ بڵێین کە ئەوەی توێژەر (!) ناوی ناوە بەڵگەی عەقڵی، هیچ پێویستی‌یەکی بە ڕەتدانەوە نیە، پاش ئەو ڕوونکردنەوانەی پێشەوە.

# حاڵی پێغەمبەر (ﷺ) پاش هاتنی وەحی



سەبارەت بە حاڵی پێغەمبەری خواش (ﷺ) - پاش هاتنی وەحی - ئەوە دەڵێین پێشتر وتمان: کە توانا نەشکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر خوێندنەوەو نوسیندا، ناتەواوی نیە بۆ ئەو، چونکە هیچ یەك لە سێ ئەرکانەکانی پێغەمبەرایەتی کەبریتین لە :

١- وەرگرتنی وەحی (نبوەت)، ٢- گەیاندنی پەیامی خوا (رسالەت)، ٣- پێشەوایەتی (ئیمامەت). پێویستیان بە شارەزایی خوێندنەوەو نوسین نیە.

لێرەدا ئەوەش دەڵێین: کە بە هیچ بەڵگەیەکی توندو تۆڵ نەسەلماوە کە پێغەمبەر (ﷺ) پاش ئەوەی وەحی بۆهات، لەگەڵ پێش ئەوەدا کە توانای خوێندنەوەو نوسینی نەبوو، هیچ گۆڕانێکی بەسەردا هاتبێ. ئەسڵێش ئەوەیە کە وەك خۆی مابێتەوە.. هەرکەس لافی غەیری ئەمە لێ‌بدا

دەبێ بەڵگە بێنێتەوە، بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەو ئەسڵە بگەیەنێ..

* سەبارەت بە ئایەتی ﴿رَسُولٌ مِّنَ اللَّهِ يَتْلُو صُحُفاً مُّطَهَّرَةً * فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ﴾ [البينة /٢-٣]. نابێ بگوترێ کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پاش پێغەمبەرایەتی شتی خوێندۆتەوە، چونکە خوێندنەوەی (صحف)، پێویست ناگێرێ خوێندنەوەکە لەناو پەڕاوەکاندا بێت، بەڵکو هەندێ جار ڕێك دەکەوێ کە مرۆڤ شتێ بخوێنێتەوە کە غەیری خۆی نوسیویەتی، بە بێئەوەی سەیری ئەو نوسراوە بکا، بەوەی کە لەگەڵ ئەوەی ناتوانێ بخوێنێتەوە، بەڵام کەسێ بەسەریدا دەخوێنێتەوەو، ئەویش لەبەری دەکات، پاشان دەیخوێنێتەوە.

ئەو (صُحُف)ش کەلە ئایەتەکەی سەرەوەدا ئاماژەیان پێکراوە، هەمان ئەوانەن لە فەرمودەی خوادا هاتوون کە دەفەرموێ: ﴿كَلَّا إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ * فَمَن شَاء ذَكَرَهُ * فِي صُحُفٍ

﴿مُّكَرَّمَةٍ *مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ *بِأَيْدِي سَفَرَةٍ *كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾ [عبس/١١-١٦].

بەڵگەش ئەوەیە لەم ئایەتەدا ئەو صەحیفانە بە (مطهرة) وەسف دەکا، وەك لە ئایەتی سەرەوەش فەرمووی:﴿صُحُفاً مُّطَهَّرَةً﴾ ئەو صەحیفانەش خوا عالمە هەر ئەو (کتاب)ەن لەم ئایەتەدا باسکراوە، کە دەفەرمویّ : ﴿ إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ* فِي كِتَابٍ مَّكْنُونٍ* لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ* تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ [الواقعة /٧٧-٨٠ ].

واتە: بەڕاستی ئەو پەیامەی بۆ محمد (ﷺ) هاتووە، قورئانێکی پڕکەرەم و بەخششە. لە کتابێکی پێچراوەدایە. جگە لە فریشتە پاکژکراوەکان، کەس دەستی تێوە نادات، ئەو پەیامە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە نێرراوە..

* ئەمەو لە ووتاری توێژەر (!)دا دەوروبەری بیست هەڵەی تر هەن، وەك: بە بەڵگە هێنانەوەی چەند ئایەتێك کە پەیوەندییان بە بابەتەکەوە نیە (کاری ئەوانەی کە لە

کەلامی خوادا ڕستەی لێك دابڕاو دەردێنن). هەروەها وەك: پشت بەستن بە ڕیوایەتی هەڵبەستراو (وەك ڕیوایەتی:" أنا مدينة العلم وعلي بابها" واتە: من شاری زانستم و عەلی دەروازەکەیەتی، کە پێچەوانەی ئایەتی خوایە کە وەسفی پێغەمبەر (ﷺ) دەکاو دەربارەی دەفەرموێ:﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً وَدَاعِياً إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجاً مُّنِيراً﴾ [ الأحزاب / ٤٥-٤٦].

واتە: ئەی پێغەمبەر! بەڕاستی ئێمە تۆمان وەك گەواهیدەرو مژدەدەرو ئاگادارکارێك ناردووە، تۆمان وەك بانگخوازێك بۆ ڕێی خواو چرایەکی ڕێ ڕۆشنکار بە ئیزنی خۆی، ناردووە.

جگە لەمانە چەندین هەڵەی تریشی تێدایە، کە لەبەر ئەوەی پێویست نیە لێرەدا وەڵامیان بدەینەوە، خۆمان لادەدەین.

لەکۆتاییدا:

ئەی پەروەردگاری ئێمە! لیێمان مەگرە ئەگەر شتێکمان لەبیرچووبێ یا هەڵەمان کردبێ.

ئەی پەروەردگاری ئێمە! کۆڵێ مەدە بەسەر شانماندا کەبەسەر پێشینانی ئێمەتدا داوە.

ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەرکێ مەدە بەسەرماندا کە بەدەر لە تواناو وزەی ئێمە بێت. لیێمان خۆش بە، لە گوناهمان ببورە، ڕەحمان پێبکە، تۆ سەروەرو سەرپەرشتمانی، سەرمانخە بەسەر خەڵکانی بێبڕوادا.

***

پێڕست

***

## بەرهەمە کوردییە چاپکراوەکانی م. ناصر
## لەلایەن (دەزگای بەرهەم)ەوە

١- بەندایەتی
٢- نوێژ( حەقیقەت و حیکمەتەکانی)
٣- پرسە و سەرەخۆشی
٤- پێغەمبەری نەخوێندەوار
٥- خەلقی ئادەم
٦- حیکمەتی حەج و عومرە
٧- سیستمی سیاسی ئیسلام
٨- علم، عالم، علماء
٩- شەهادەت، شاهید، شەهید
١٠- ئەحکام و حیکمەتەکانی ڕۆژوو
١١- فەرهەنگی خۆرئاوا
١٢- ناسخ و مەنسوخ
١٣- ژن و مێردایەتی
١٤- وانەکانی خواناسی
١٥- بنەماکانی جیهانبینیی ئیسلامی
١٦- قەدەر و قەزا و جەبر و ئیختیار
١٧-مرۆڤ و ڕێبازی ژیان




**دەزگای بەرهەم**
بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی سوبحانی
dazgaibarham@hotmail.com